حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# کۆمپیوتەر

## مایکرۆسۆفت ئەکسس

## بۆ پۆلا یازدێ ئامادەیی

**دانان**

سۆران نەریمان حمە صالح | ئومێد صادق عبدالکریم

محمد ئەبوبکر تۆفیق | هادي حمە رەضا عزیز

روناک محمد عبدالله | ڕێزان حمە ڕەشید کریم

**هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ**

سربست توفیق عارف | مصطفی سلیمان محمد

غریبة شعبان عمر

**پێداچوونا زمانی**

طە یاسین طە

**پێداچوونا زانستی**

سگڤان حسن علي

چاپا سێیێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# ناڤەرۆک

# پێشگوتن

ب ڕاستی دەمێ بەحسێ کۆمپیوتەری دهێتەکرن نابیت ئەم تنێ وەکی هەر ئامیرەکێ دی لێ بنێرین ، بەلکی پێدڤییە وەك سیستەمەکێ سەرتاسەری و خزمەتگوزاری و هەڤچەرخ و مرۆڤایەتیێ کێشا راستەقینەیا وی بدەینێ.

ل ژێر سیبەرا مفایێ بێ سنوورێ کۆمپیوتەری ، نەخشەیێ کێشەیێ، جورا و جۆرێن ژیانا رۆژانەیا مە ب هەمی بوارێن وێڤە ، ئەوێن زانستی و نەزانستی زۆر بچووکتر بوویە و رێکێن مە نزیك بووینە و هەر ژ بەر هەبوون و ئەگەرێ کۆمپیوتەری زۆربەیا کێشەیێن مە یێن رۆتین و بیروکراتی ل دام و دەزگەهێن حکومی ب رێژەیەکا بەرچاڤ کێم بووینە یان ژی هاتینە بنبڕکرن.

هەروەسا ئاسانکاری دبیاڤێ نوژداریدا هاتیە کرن کو رۆژانە ژیانا دەهان هەڤ وەلاتیان ژمرنێ رزگار دبیت. هەر کۆمپیوتەرە ب شارەزایی پشکدار دبیت د سەرتاسەری تەکنەلۆژیا دروستکرن و پێشخستنا دروستکرنا هەمی ئامیرێن میکانیکی و ئەلکترونییاندا ....هتد.

ئێك ژ بنەمایێن هەرە گرنگێن پێڤە وەستیانێ ژبۆ بساناهیکرنا ژیانا مە یا هەڤچەرخا ئەڤرۆ پێکهاتەیێ هەبوونا کۆمپیوتەرییە دژیانا مەدا و یاتێکەلە دگەل هەمی پێداویستی و کارێن مەیێن هویر یێن رۆژانە.

لەوڕا فێربوون د بکارئینانا ڤی ئامیرەیدا سودمەند و مفادارە کو سەرەدەریێ دگەل بکەین ، ژ پێدڤیێن گەلەك گرنگە ژبۆ ژیانا مەیا ئەڤرۆ و نابیت ل ژێر چ ناڤ و نیشانەکێدا ئەم بسەردا بازدەین یان پشت گوە باڤێین.

## مایکرۆسۆفت ئەکسس Microsoft Access

پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئەکسسی ژ بەرهەمێن کۆمپانیا (مایکرۆسۆفت)ییە ودناڤ پرۆگرامێن (Microsoft Office ) یدا یە. ئەڤ پرۆگرامە تایبەتە ب تۆمارکرن و دروستکرنا بنکێن زانیاریان Database بۆ کارێن پێزانینان و ژمێریاری و ئامار و... هتد، هەروەسا گرێدان دگەل چەند پرۆگرامێن دی بۆ بەلاڤکرن و لەزێ دکاریدا.

Database (بنکا زانیاریان): پێك دهێت ژ کۆمەکا زانیاریان کو رێکخستینە بشێوەیەکێ زانستی و پێگڤە د گرێداینە و برێیا وان دشیاندایە زانیاریان تۆمار بکەین و چارەسەریا گیروگرفتان پێ بکەین. دووسەییێن دهێنە ڤەگرتن(Save) برێیا ڤی پرۆگرامی ژ جۆرێن (mdb) نە.

## ڤەكرنا پرۆگرامێ Microsoft Access

چەند رێك هەنە بۆ ڤەكرنا پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت ئەكسس Microsoft Access، د ڤێرەدا ئەم دێ ئاماژە ب ئێك ژوان رێكان كەین برێیا ڤان پێنگاڤێن لخوارێ دیار كری:-

١- Start كلیك بكە.

٢- All Programs یان Programs هەلبژێرە.

٣- Microsoft Access یان Microsoft Office لدوڤدا Microsoft Access كلیك بكە.

**هێلكارێ ڤەكرنا پرۆگرامی:**

## پێکهاتێن پرۆگرامێ ئەکسسی:

١. Title Bar

٢. Menu Bar

٣. Database Toolbar

٤. Formatting (datasheet)

٥. Task Pane

٦. Status Bar

## پشتی ڤەکرنا پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئەکسسی:

دناڤ پشکا (Task Pane) دا (Blank Database) کلیك دکەین بۆ ئامادەکرن و دروستکرنا دووسەیەکا نوی، د ڤی دەمیدا دایلوك بۆکسەك دێ هێتە ڤەکرن، دەسپێکێ دناڤ پشکا (File Name) دا دێ ناڤەکی بۆ دووسەیێ نڤیسین و دپشکا (Save in) دا دێ جهێ دووسە دناڤدا دهێتە ڤەگرتن دەستنیشانکەین.

پاشان دێ دوگما (Create) کلیك کەین.

لدووڤدا دایلوك بۆكسا تایبەت ب پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت ئەكسس بەرچاڤدبیت، دناڤ ڤێ دایلوك بۆكسێدا هەمی پشكێن داتابەیسی دیارن وهەر پشكەك یا تایبەتە بكارەكێ سەربەخۆ وب هاریكاریا پشكێن دی كار دهێتە ئەنجامدان.

## پشکێن داتابەیسی

**ئێك : Tables** خشتە وەك بنیاتێ بنكا زانیاریان Database دهێنە هژمارتن، دشیاندایە ب چەند رێكان خشتەی دروست بکەین و زانیاری و داتایان دناڤدا تۆماربکەین کو هەر رێکەکێ تایبەتمەندیێن خۆ هەنە.

**دوو : Queries** ئانکو پرسگەهـ، دڤێ پشکێدا دشیاندایە کارێ ڤاڤارتنێ و ژمێریاریێ ب رێکەکا بلەز ئەنجامبدەین ژ بۆ بەرسڤدانا هەر پرسیارەکا ژ مە بهێتە کرن بشێوەیەکێ دیار رێکێ لبەر مە خوش دکەت ژبۆ گەهشتن بۆ زانیاریێن مەبەست پێ .

**سێ : Forms** دڤێ پشکێدا دشیاندایە زانیاریێن دناڤ خشتەیاندایە ببینین و هەروەسا تۆمارکرن و گوهۆڕینا وان و دیتنا وێنەیێن دناڤ زانیاریان هاتینە تۆمارکرن.

**چوار: Reports** راپۆرت، دناڤ راپۆرتاندا دشیاندایە خشتەی و پرسگەهێ بکەینە راپۆرتەك و پاشان چاپ بکەین یان ژی بنێرین بۆ پرۆگرامەکێ دی.

**پێنج: Pages** دناڤ بەرپەڕاندا دشیاندایە زانیاریان کۆمبکەین و داکەینە ناڤ ماڵپەڕەکێ تایبەت (ئینتەرنێت).

**شەش: Macros** ژ کۆمەکا فەرمانان پێك هاتیە ،ئەڤ فەرمانە لدووڤ ئێك دهێن و لبن ئێك ناڤ دهێنە دانان ژ بۆ ئەنجامدانا کاری ب دەمەکێ کێم.

**حەفت: Modules** کۆمەکا فەرمانێن زمانێ (فیجوال بەیسك)ن.

❖ هەروەسا لسەر دایلوك بۆکسێدا سێ ئایکون هەنە و بڤی شێوەی.

* New (نوی): بۆ دروستکرنا پشکەکا تازە.
* Design (دیزاین): بۆ ڤەکرن وچوونا دناڤ دیزاینێ پشکا دەستنیشانکریدا.
* Open (ڤەکرن): بۆ ڤەکرنا پشکا مەبەست پی.

**ئێك/** Tables بەشەکێ سەرەکییە وژهەمی بەشێن بنکێن زانیاریان (Database) گرنگترە ژبەر کو ب نەبوونا خشتەی ئەم نەشێین چ کاران لسەر پرۆگرامێ ئەکسسی ئەنجامبدەین، لەورا بەری هەر کارەکی پێدڤییە خشتەی دروستبکەین کو بڤی شێوەیێ لخوارێ دیار کری یە :

پشتی ڤەگرتنا بنکا زانیاریان (Database) و بڤەکرنا وێ دێ ئەڤێ بۆکسێ نیشا مەدەت.

کو دناڤدا لڤا دروستکرنا خشتەی هەیە.

# جۆرێن Data Type

١- Text : هەر داتایەکا پەیوەندی بنڤیسینێ ڤە هەبیت وەك (پیت، ژمارە، هێما، ...هتد) دشیاندایە ڤی جۆری بۆ ب هەلبژێرین و هەروەسا دشیاندایە دناڤ فیلدێ ژ ڤی جۆری هەتا (٢٥٥) ان بۆ دەستنیشانبکەین.

٢- Memo : هەر وەکۆ ژ جۆرێن (Text) لێ لدووڤ قەبارێ نڤیسینێ ئەڤ جۆرە خۆ د گونجینیت ، دشیاندایە هەتا (٦٥٥٣٥)ان بۆ دەستنیشان بکەین.

٣- Number: بۆ تۆماركرنا نمران دهێته بكارئينان.

٤- Date /Time: بۆ تۆماركرنا بەروار و دەمی دهێته بكارئينان.

٥- Currency: بۆ تۆماركرنا ژمارەيێن پەيوەندی ب دراڤی ڤە هەين دهێته بكارئينان.

٦- Auto Number: بۆ وان فيلدێن كو بشێوەيەكێ ئۆتۆماتيكی ژمارەيان تۆماربكەت وەك فيلدێ (زنجيرە).

٧- Yes/No: بۆ وان فيلدێن داتايێن وان بتنێ (بەلێ، نەخێر) يان (بكارئێخستن و ڤەمراندن) ....هتد.

٨- OLE Object: بۆ دانانا وێنەيان و رەنگان دهێته بكارئينان.

٩- Hyperlink: ئەڤ پشكە يا تايبەتە ب لكاندنا خانەيەكێ ب خشتەيەكێ دی د پرۆگرامێ ئەكسسيدا يان فايلەكێ پرۆگرامەكێ دی.

١٠- Lookup Wizard: ئەگەر مەبڤێت زانياريێت مە دناڤ فيلديدا بشێوێ ليستەيەكێ بەرچاڤبكەين ، دێ ڤی كاری برێيا ڤێ پشكێ ئەنجامدەين.

# تايبەتمەندييێن فيلدى

# Field Properties

## ئێك : نڤيسين Text

١- Field Size : د ڤێرەدا دشياندايە ژمارا پيتان دناڤ فيلديدا دياربكەين كو دشياندايە ژ (١-٢٥٥) پيت و ژمارە و هێما و... هتد پێكدهێت.

٢- Format : دڤێ پشكێدا دشياندايە رەنگێ نڤيسينێ بگوهۆڕين، وەك نموونە ئەگەر مە بڤێت رەنگێ نڤيسينا فيلدێ (ناڤ) بگوهۆڕين بۆ رەنگێ(سۆر) دێ دناڤ ڤێ پشكێدا [Red] @ نڤيسين.

٣- Input Mask : دڤێ پشکێدا د شیاندایە شێوەیێ نڤیسینێ دناڤ فیلدیدا دیار بکەین ئەوژی بڕێیا چەند هێمایان وژمارەیان وەك (@، &، \ ،٩، ٠ ،.....هتد).

٤- Caption : دڤێ پشکێدا دشیاندایە ناڤ ونیشانێن فیلدی بتمامی بنڤیسین وەك دنموونەیا مەدا دیارە فیلدێ دووێ مە ب (ناڤ) ناڤکریە لێ ئەگەر مەبڤێت ل نمایشکرنێ ب تمامی بهێتە بەرچاڤکرن دێ د ڤێ پشکێدا نڤیسین (ناڤێ سێ قولی).

٥- Default Value : بۆ بەرچاڤکرنا زانیاریەکێ بشێوەیەکێ راستەخۆ بۆ هەر تۆمارەکێ ، ئەوژی بۆ زانیاریا ژ هەمیان پتر دهێتە دووبارەکرن وەك نموونە دفیلدێ (ناڤ ونیشان)دا ئەگەر زانیاریێن مە لسەر کەسانێن ئاکنجی ل پارێزگەها دهوکێ بن ئەڤجا پەیڤا(دهوك) دێ دناڤ ڤێ پشکێدا نڤیسین.

٦- Validation Rule : دڤێ پشکێدا دشیاندایە مەرجەکی دانین بۆ زانیاریێن دهێنە وەرگرتن دناڤ فیلدیدا.

بۆ نموونە دفیلدێ (مووچە)دا دشیاندایە مەرجەکی دانین وەك مووچە (150000) بیت یان زێدەتر، ئەوژ بنڤیسینا (150000=<) دناڤ ڤێ پشکێدا.

٧-Validation Text : دڤێ پشکێدا دشیاندایە دانانا نڤیسینەکا ئاگەهدارکرنێ لدەمێ زانیاریا فیلدی نەگونجیت دگەل مەرجێ هاتیە دانان دپشکا (Validation Rule) دا. ئەم دئازادین بنڤیسینا ئاگەهداریێدا.

## دوو : ژمارە Number

زۆربەیا تایبەتمەندێن ڤی جۆری هەر وەکو تایبەتمەندێن (Text) ی نە.

١- Field Size : دڤێرەدا دشیاندایە قەبارێ ژمارەیێ دیار کەین.

٢- Format : دڤێ پشکێدا دشیاندایە شێوازێ ژمارێ هەلبژێرین.

٣- Input Mask : دڤێ پشکێدا دشیاندایە سنورەکی بۆ تۆمارکرنا ژمارەی دانین.

٤- Caption : دڤێ پشکێدا دشیاندایە ناڤ ونیشانێن فیلدی بتمامی بنڤیسین.

٥- Default Value : بۆ بەرچاڤکرنا زانیاریەکێ بشێوەیەکێ راستەخۆ بۆ هەر تۆمارەکێ، ئەوژی بۆ زانیاریا ژ هەمیان پتر دهێتە دووبارەکرن.

٦- Validation Rule : دڤێ پشکێدا دشیاندایە مەرجەکی دانین بۆ زانیاریێن دهێنە وەرگرتن دناڤ فیلدیدا.

بۆ نموونە دفیلدێ (ژمارا زارویان)دا دشیاندایە مەرجەکی بدانین وەك (>=0 and<=10) ئانکو ژمارا زارۆیان یان (چنە) یان ژی پتر هەتا دگەهیتە (١٠)ا.

٧- Validation Text: د ڤێ پشکێدا دشیاندایە دانانا نڤیسینەکا ئاگەهدارکرنێ لدەمێ زانیاریا فیلدی نە گونجیت دگەل مەرجێ هاتیە دانان دپشکا (Validation Rule) دا. بۆ نموونە ئەگەر مە ژمارا زارۆیان نڤیسی (١٢) نڤیسینەك دێ ئاگەهداریا مەکەت.

بۆ تیبینی ئەگەر مە مەرج دانابیت وئەڤ پشکە ڤالا بمینیت دێ پرۆگرامێ ئەکسسی راستەوخۆ نڤیسینەکا ئاگەهداریێ بەرچاڤکەت لدەمێ نڤیسینا مە دگەل مەرجی نەگونجیت.

## رێکێن دروستکرنا خشتەی

دناڤ بۆکسێدا پشتی کلیککرن لسەر (Table) سێ رێك بۆ دروستکرنا خشتەیان بۆ مە بەرچاڤدبن ئەو ژی ئەڤەنە.

١. Create Table in Design view
٢. Create Table by using wizard
٣. Create Table by entering data

### ١-Create Table in Design view

د ڤێرەدا لدووڤ حەز و پێدڤیێن مە دشیاندایە خشتەی دروستبکەین و بڤی شێوەی.

* پشتی جووت کلیککرن لسەر رێکا Create Table in Design view ئەڤ بۆکسە دێ هێتە ڤەکرن.

❖ پشتی نڤیسینا ناڤێن فیلدان و دەستنیشانکرنا جۆرێن وان ، دێ ئایکونێ ( View ) کلیك کەین، پاشان دێ بۆکسەك بەرچاڤبیت بۆ ڤەگرتنا خشتەی بناڤەکی ، و پشتی ناڤەك بۆ خشتەی دهێتە دەستنیشانکرن دێ ئێکسەر خشتە هێتە ڤەکرن و بڤی شێوەی.

**تێبینی :**

* پشتی خشته هاتیه دروستکرن دشیاندایه ناڤێ فیلدی بگوهرین، بۆ ڤێ مەبەستێ چەند رێك هەنە، بساناهیترین رێك لدەمێ بەرچاڤکرنا خشتەی جووت کلیکەکێ لسەر ناڤێ فیلدی بکە وئێکسەر ناڤی بگوهۆڕە.

* بۆ سەلماندنا جۆر وقەبارێ نڤیسینێ دڤی پرۆگرامیدا راستەوخۆ ئایکونێ Font و Font Size بکاربینە.

## گوهۆڕینا ئاراستە وشێوازێ خشتەی

پشتی ڤەکرنا خشتەیێ مەبەست، دناڤ لیستەیا (Format) دا فەرمانێ (Datasheet) دێ هەلبژێرین، بۆکسەك بەرچاڤ دبیت، کو دناڤدا دشیاندایە شێوازێ و هێلێن ئاسویی و ستووینی یێن خشتەی بگوهۆڕین ،هەروەسا دشیاندایە ئاراستێ خشتەی بگوهۆڕین.

ئەگەر مەبڤێت خشتەی ب(کوردی یان عەرەبی) دروستبکەین، پێدڤییە پشکا (Right to Left) دەستنیشانبکەین، لێ ئەگەر مە بڤێت خشتە ب (ئینگلیزی) دروستبکەین پێدڤییە پشکا (Left to Right) دەستنیشانبکەین، لدووڤدا (Ok) کلیك بکە.

## Create Table by Using Wizard-٢

بكارئينانا ڤێ رێكێ دشياندايه مفاى ژ زانياريێن بەرهەڤكرى دناڤ پرۆگرامێ

ئەكسسيدا وەربگرين بۆ دروستكرنا خشتەيەكى وبڤى شێوێ لخوارێ ديار كرى.

*دەسپێكێ جووت كليكەكێ لسەر (Create Table by Using Wizard)

دكەين، ئەڤ بۆكسە دێ بۆ مە بەرچاڤبيت.

١- دیار کرنا بابەتێ خشتەیێ (کەسی، بازرگانی، ودناڤ (Sample Table) دا هەلبژارتنا ناڤێ خشتەی.

٢- لدووڤ خشتەیێ هەلبژارتی ناڤ ونیشانێن فیلدان، دڤێرەدا دێ چەند فیلدان هەلبژێرین کو پەیوەندی ب بابەتێ مەڤە هەبیت.

٣- برێکا ڤان چوار ئایکونان دشیاندایە فیلدان هەلبژێرین وڤەگوهێزین بۆ ناڤ خشتەیێ ئەم ئامادەدکەین.

٤- ئەو فیلدێن هاتینە دەستنیشانکرن بۆ ناڤ خشتەیێ مە.

❖ پشتی هەلبژاتنا فیلدان دێ دۆگما (Next) کلیك کەین ، ئەڤ بۆکسا لخوارێ بەرچاڤدبیت ، کو دشیاندایە ڤان کاران لسەر ئەنجامبدەین.

١-دانانا ناڤەکی بۆ خشتەی.

٢-ژ دوو هەلبژارتنان پێك دهێت یا ئێکێ دەستنیشانکرنا کلیلکا سەرەکی ژلایێ پرۆگرامی ڤە ، یا دووێ دانانا کلیلکا سەرەکی ژلایێ بکارهێنەری ڤە.

❖ دۆگما ( Next )کلیك کەین بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە دناڤدا خشتەیێ خۆ ب گرێدەین دگەل خشتەیەکێ دیدا برێیا (Realationship - پەیوەندیان)، لێ ئەگەر مە نە ڤێت خشتەیێ خۆ دگەل خشتەیەکێ دی گرێدەین دێ بتنێ دۆگما (Next) کلیککەین.

پاشان بۆکسەکا دی بەرچاڤدبیت ، سێ هەلبژاردن دناڤدا هەنە، دشیاندایە ب رێیا وان خشتەی ڤەکەین لدویڤ شێوەیێ مەبڤێت (گوهۆرینا دیزاینا خشتەی، ڤەکرنا خشتەی وئێکسەر تێئێخستنا زانیاریان ، ڤەکرنا خشتەی بشێوەیێ فۆرمەکێ وتێئێخستنا زانیاریان.

لدووڤدا دۆگما (Finish) كلیكدكەین وخشتە لدووڤ شێوێ هەلبژاردی بەرچاڤدبیت.

## ٣-Create Table by Entering Data

دەمێ جووت كلیكەكێ لسەر ڤێ رێكێ دكەین ئێكسەر خشتەیەكێ پێكهاتی ژ (١٠) فیلدان بۆمە دێ هێتە ڤەكرن دشیاندایە زانیاریان دناڤدا تۆماربكەین وهەروەسا دشیاندایە ژمارەیا فیلدان ژی زێدەبكەین. خشتە وەك وێنەیێ لخوارێ دیار دێ هێتە ڤەكرن.

## ڕوونكرنەك:

دشیاندایە خشتەیەكی دروست بكەین بڕێیا (New) ئەوا دكەڤیتە دناڤ بۆكسەیا داتابەیسیدا، پشتی (New) دهێتە كلیككرن ئەڤ بۆكسە دێ بەرچاڤبیت.

*Import Table: دهێتە بكارئینان بۆ ئینانا خشتەی ژ پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت ئێكسل یان ژ پرۆگرامێ مایكرۆسۆفت ئەكسس بۆ ناڤ دووسەیا ئەكسسی ئەوا ئەم كاری لسەر دكەین، وبڤی شێوێ لخوارێ دیار كری.

١- دۆگما (New) كلیك دكەین.

٢-Import Table دێ هەلبژێرین پاشی (OK) كلیكدكەین.

ئەڤ بۆكسە دێ بەرچاڤبیت:

٣-دۆگما (Import) دێ کلیك کەین. دێ بۆکسەکا دی بەرچاڤبیت.

أ- بۆ بەرچاڤکرنا شیتێن دناڤ دووسەیا (پەرتۆکا) ئێکسلی دهێتە بکارئینان، ئەو شیتێ خشتێ مەبەست پێ دناڤدا دەست نیشاندکەین.

ب- ئەگەر مەبڤێت بتنێ پشکەکێ ژ خشتێ مەبەست پێ ڕابکێشین بۆ ناڤ پرۆگرامێ مە (ئەکسس) یدا. و بۆ زانین ئەڤ پشکە گەلەك کێم دهێتە بکارئینان.

٤- دۆگما (Next) کلیك دکەین.

Import Spreadsheet Wizard

Microsoft Access can use your column headings as field names for your table. Does the first row specified contain column headings?

☑ First Row Contains Column Headings

دهێتە بکارئینان بۆ دەستنیشانکرنا ڕیزا ئێکێ ژ خشتەی وەك ناڤ ونیشانێن فیکلدێن خشتەی

| | ذمارة | ناظىَ سىَ قولى | ثيشة |
|---|---|---|---|
| 1 | 1 | كوردستان محمد جميل | ماموستا |
| 2 | 2 | ابراهيم سليم محمد | ئةندازيار |
| 3 | 3 | ديلان كاميران جاسم | ماموستا |
| 4 | 4 | شيروان حسن على | فةرمانبةر |

Cancel | < Back | Next > | Finish

٥- دۆگما (Next) کلیك دکەین.

أ- ئەگەر مەبڤێت ئەو خشتەیێ ژ پرۆگرامێ ئێكسلیدا دئینینە دناڤ دووسەیا مە د پرۆگرامێ ئەكسسیدا بهێتە دانان دناڤ خشتەیەكێ نویدا، دێ ڤی بەشی هەلبژێرین.

ب-ئەگەر مەبڤێت ئەو خشتەیێ ژ پرۆگرامێ ئێكسلیدا دئینینە دناڤ دووسەیا مە د پرۆگرامێ ئەكسسیدا بهێتە دانان دناڤ خشتەیەكێ ئامادەكری دپرۆگرامیدا، دێ ڤی بەشی هەلبژێرین.

٦-دۆگما (Next) كلیك دكەین، ئەڤ بۆكسە دێ هێتە ڤەكرن، كو دشیاندایە برێیا وێ گوهۆڕینا لسەر ناڤێن فیلدان ئەنجامبدەین وناڤێن دووبارەكری ژێك جودا بكەین.

٧- دۆگما (Next) كليك دكەين ، بۆكسەكا نوى بەرچاڤدبيت، دڤێرەدا دشياندايە كليلكا سەرەكى بۆ خشتەى دانين برێيا پرۆگرامى يان ژى نەدانين.

دۆگما (Next) كليك دكەين، بۆكسا دوماهيێ بەرچاڤدبيت.

٩-دۆگما (Finish) کلیکدکەین ، ئێکسەر خشتە دێ هێتە زێدەکرن دناڤ دووسەیامەدا.

## تێبینی:

خشتێ هاتیە ئینان دبیتە خشتەیەکێ سەربەخۆ پەیوەندی ب خشتێ بنەڕەتی یێ مایکرۆسۆفت ئێکسلی نامینیت.

## *Link Table:

هەر بهەمان شێوێ هاتیە بکارئینان بۆ (Import Table)ی، دشیاندایە خشتەیەکی ژ پرۆگرامەکێ دی یان ژ هەمان پرۆگرامدا بینینە دناڤ داتابەیسا مەدا. لێ دڤێرەدا پەیوەندیا خشتەیێ راکێشای دگەل خشتەیی بنەرەتی دمینیت، ئانکو هەر گوهۆڕینەکا دناڤ داتابەیسا مەدا لسەر خشتەیی راکێشای ئەنجامبدەین ئەو گوهۆڕینە دێ ئێکسەر لسەر خشتەیی بنەرەتی ژی هێتە ئەنجامدان وبەرۆڤاژی دروستە.

بکارئینانا پێنگاڤێن (٣ - ٩) یێن بابەتێ (Import Table) دێ بۆکسا بنکا زانیاریان بڤی شێوەی لخوارێ دیار کری بەرچاڤبیت ، دوینەیدا بنێرە خشتەیێ برێیا (Link Table) هاتیە ئینان:

## چەوانیا داكرنا وێنەی Insert Picture

پشتی مە لدیزاینێ خشتەی فیلدەك بۆ وێنەی دانای، بۆ داكرنا وێنەیان لسەر ڤی فیلدی دێ ڤان پێنگاڤان بكارئینین:

١- ڤەكرنا خشتەی بڕێیا جووت كلیككرن لسەر ناڤێ وی.

٢-كلیكا راستێ یا ماوسی لسەر فیلدێ هاتیە دانان بۆ وێنەی بكاربینە.

٣-لیستەیەك بەرچاڤدبیت دناڤدا (Insert Object) كلیك بكە، ئەڤ بۆكسە دێ هێتە ڤەكرن، دناڤدا پشكا (Create from file) كلیك بكە.

٤- دۆگما ( Browse) كلیكدكەین، ئەڤ بۆكسە بۆ مە دێ هێتە ڤەكرن، كو دناڤدا جهێ وێنە تێدا هاتیە ڤەگرتن دێ دەستنیشانكەین و وێنەیێ مەبەست پێ داكەینە دناڤ فیلدیدا دێ هەلبژێرین (وێنە دڤێت بشێوێ (bmp ) بیت) پاشان دێ دۆگما (OK) كلیك كەین.

**تێبینی:**

دناڤ خشتەیدا وێنە بەرچاڤ نابیت بەلكو دناڤ فۆرمێن لسەر خشتەیان دهێنە ئامادەكرن دێ هێنە بەرچاڤكرن.

# کردارا ڤاڤارتنێ د خشتەیدا

دشیاندایە ب دوو رێکان کردارا ڤاڤارتنێ دناڤ خشتەیدا بکاربینین ، ئەوژی ئەڤەنە:

١-ڤاڤارتن ب دەستنیشانکرنێ ( ) Filter by Selection.

پشتی مە برێکا (Design View) گوهۆڕانکاری لسەر خشتەی ئەنجامداین، دشیاندایە نوکە ئەم کاری لسەر خشتەی بکەین ئەوژی برێکا ڤەکرنا خشتەی.

Table1 : Table

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 2 | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 4 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| 5 | كوردستان كمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| 6 | كامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| 7 | حسێن ابراهیم كریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

ئێك ژ کردارێن گەلەك گرنگ (کردارا ڤاڤارتنێ)یە، کو دشیاندایە بۆ هەر فیلدەکێ مەبەست پێ ڤێ کردارێ ئەنجامبدەین وبڤی شێوەی:

أ-ئەو داتایا مەبەست پێ بۆ ڤاڤارتنێ دێ دەستنیشانکەین برێیا کلیککرن بدۆگما ماوسێ چەپێ لسەر فیلدێ داتای ، پاشان کلیککرن لسەر ئایکونێ ( ) Filter by Selection پاشان بتنێ ئەو تۆمارە دێ بەرچاڤبن ئەوێن وەکهەڤ لدووف زانیاریێن دناڤ فیلدێ کلیککریدا.

## هەروەكو دڤان وێنەیاندا دبینین:

| زنجیره | ناڤ | پیشه | مووچه | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 3 | احسان محمد سليمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 4 | بهار احمد ابراهيم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| 7 | حسين ابراهيم كريم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

ڤاڤارتن لدووف پیشەی (مامۆستا)

Table1 : Table

| زنجیره | ناڤ | پیشه | مووچه | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 3 | احسان محمد سليمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

ڤاڤارتن لدووف مووچەی ($500)

ب- بۆ زڤرین بۆ ناڤ خشتەیێ سەرەكی (زانیاریێن بنەرەت) یان كو لابرنا ڤاڤارتنێ دێ ئایكونێ ( ) Remove Filter كلیك كەین.

٢-ڤاڤارتن بشێوێ فۆرمی Filter by Form ( ).

بڤێ رێكێ دشیاندایە كردارا ڤاڤارتنێ بشێوەیەكێ هویرتر ئەنجامبدەین.

## نموونەیا (١):

ئەگەر د خشتەیێ مەدا مە بڤێت گەریانەکێ لسەر کەسێن پیشەیێ وان (مامۆستا) و ئاکنجییێن (دهوك) بن، دێ ئایکونێ Filter by Form ( ) کلیك کەین، دێ بڤی شێوەی خشتە بەرچاڤبیت:

Table1: Filter by Form

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | 500 | | | ☐ | | |

پاشان هەر نڤیسینەکا دیار دێ لادەین و دێ دفیلدێ (پیشە) دا (مامۆستا) هەلبژێرین و دفیلدێ (ناڤ ونیشان)دا (دهوك) هەلبژێرین، هەر وەکو دیار دڤی وێنەیدا.

Table1: Filter by Form

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | "مامۆستا" | | | | ☐ | "دهوك" | |

لدووڤدا دێ ئایکونێ ( ) Apply Filter کلیك کەین، دخشتەیدا هەر کەسەکێ پیشەیێ وی (مامۆستا) بیت وئاکنجییێ (دهوك) بیت دێ هەمی زانیارییێن وی بەرچاڤبن.

Table1 : Table

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 4 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

## نموونەیا (٢):

مەدڤێت لێگەڕیانێ لسەر وان کەسان بکەین ئەوێن پیشەیێ وان (ئەندازیار) وموووچەیێ وان ($500) بن.

پشتی ئایکونێ ( ) Apply Filter دهێتە کلیککرن دێ خشتەیەکێ بەتال بۆ مە بەرچاڤبیت ژ ئەگەرێ نەبوونا کەسەکی دناڤ خشتەیێ مەدا کو کارێ وی (ئەندازیار) بیت و مووچەیێ وی ($500)بن. هەروەکو دیار د وێنەیدا.

Table1 : Table

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| (Auto | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

## تێبینی:

پشتی ئەم بکارێ ڤاڤارتنێ رادبووین، خشتێ مە دێ زڤریتە بۆ بارێ خۆ یێ ئاسایی، هەروەکو دیار دوێنەیدا.

Table1 : Table

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | ناڤ ونیشان | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 2 | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 4 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| 5 | کوردستان کمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| 7 | حسین ابراهیم کریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

## دوو/ پرسگەهـ Queries

دڤێ پشكێدا وەكو پرسگەهەك دشیاندایە هەمی زانیارییێن لسەر داتابەیسامە وەربگرین، چەند جۆر ژ پرسگەهان هەنە وبڤان رێكان دهێنە دروستكرن.

### ١- Create Query In Design View

دڤێ رێكێدا لدووف حەز و پێدڤییێت مە دشیاندایە پرسگەهێ دروست بكەین بڤی شێوەی.

❖ جووت كلیك لسەر Create Query in Design View دكەین، ئەڤ وێنەیە بەرچاڤدبیت.

## کو دوو بۆکس دناڤدانە :

بۆکسا ئێکێ تایبەتە ب وان خشتەیێن هاتینە دروستکرن دناڤ داتابەیسا مەدا بۆ وێ چەندێ ئەو خشتەیێ مەبڤێت پرسگەهێ بۆ دروستبکەین دناڤ ڤێ بۆکسێدا هەلبژێرین وڤەگۆهێزین بۆ بۆکسا (تۆڕا) پرسگەهێ ئەوژی بکلیککرن لسەر دۆگما (Add) پاشان بکلیککرن لسەر دۆگما (Close).

بۆكسا دووێ یا تایبەتە ب دروستكرنا پرسگەهێ ودبێژنێ (تۆڕا پرسگەهێ) ، ئەڤ تۆرە ژڤان لقان پێكدهێت:-

أ-Field: جهێ دانانا ناڤ ونیشانێن فیلدێ دهێتە كێشان ژ خشتەی.

ب-Table: ناڤێ خشتەیێ Field ژێ هاتیە كێشان.

ج- Sort: تایبەتە ب ریزكرنا پێزانینان لدووڤ فیلدێ هاتیە دەستنیشانكرن ئەوژی (٣) هەلبژاردن دناڤدانە (Assending) بۆ ریزكرن ژ بچووكی بۆ مەزنی، (Dessending) بۆ ریزكرن ژ مەزنی بۆ بچووكی، (not sorted) بێ ریزكرن.

د-Show: بۆ بەرچاڤكرن وڤەشارتنا فیلدان لدووڤ مەبەستا مە.

هـ- Criteria: تایبەتە ب دانانا وی مەرجێ مە بڤێت بۆ دیار كرنا پێزانینان برێیا پرسگەهێ.

و-Or: ئەوژی تایبەتە بمەرجێ دهێتە دانان. دڤێرەدا ئەگەر مەرجەك دخانەیا ( Creteria ) دا هاتە دانان ومەرجەك دخانەیا (Or) دا هاتە دانان ، ئەگەر ئێك ژ هەردوو مەرجان دروستبیت دێ پێزانینێن وێ تۆمارێ بەرچاڤبن.

**نموونە :** مەدڤێت پرسگەهەكێ بۆ خشتەی دروستبكەین.

لدەسپێكێ دێ خشتەی هاڤێنە دناڤ تۆرا پرسگەهێ هەر وەكو بەری نوكە مە ئاماژە پێ كری، دێ وێنەیەكێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت.

فيلد برێيا راكێشان وبەردانێ يان ژى برێيا جووت كليكێ لسەر ناڤێ فيلدى بۆ ناڤ تۆڕێ دهێنە زێدەكرن. دناڤ خانەيا (Creteria)دا، دێ وێ پرسيارێ (مەرجێ) مەبەست پێ نڤيسين، بۆ نموونە مەدڤێت بزانين دناڤ خشتەيێ مەدا چەند كەس هەنە كو مووچەيێ وان (500) دولارن، دێ دناڤ رێزا (Creteria) دا و لژێريا فيلدێ (مووچە) نڤيسين (500). دشياندايە ڤێ هاوكێشەيێ بڤى شێوەى بنڤيسين:-

=500

پاشان دێ ئايكونێ (Run) يان ژى ئايكونێ (View) كليك كەين، دێ ئەنجام بۆ مە بەرچاڤبن.

زانیاریێن مه دێ بشێوێ دیار کری د وێنەیی خوارێدا بەرچاڤبن

پرسیارا مه لسەر مووچەی بۆ، لێ دبینین هەمی فیلدێن پرسگەهێ دهێنە بەرچاڤکرن، دشیاندایە برێیا خانەیا (Show) فیلدێن نە پێدڤی ڤەشێرین، ژ بۆ ڤێ چەندێ نیشانا راست (☑) دێ راکەین ئەوژی بکلیککرن لسەر خانەیا (Show) لژێریا فیلدی.

پاشان دێ ئایكونێ ( Run) یان ژی ئایكونێ ( View) كلیك كەین، دێ ئەنجام بڤی شێوەی بۆ مە بەرچاڤبن.

Query1 : Select Query

| زنجیره | ناڤ | پیشه | مووچه |
|---|---|---|---|
| ١ | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $٤٢٥,٠٠ |
| ٢ | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $٧٠٠,٠٠ |
| ٣ | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $٥٠٠,٠٠ |
| ٤ | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $٤٠٠,٠٠ |
| ٥ | كوردستان كمال انور | ئەندازیار | $٥٥٠,٠٠ |
| ٦ | كامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $٤٨٠,٠٠ |
| ٧ | حسین ابراهیم كریم | مامۆستا | $٤٧٠,٠٠ |
| ٨ | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $٥٠٠,٠٠ |

Record: ١ of ٨

## ٢- Create Query By Using Wizard

پشتی جووت کلیکەکێ لسەر زاراڤی ناڤبری دکەین، بۆکسەك بۆ مە بەرچاڤدبیت، کو دشیاندایە دناڤ ڤێ بۆکسێدا خشتەیی وان فیلدێن مەبەست پێ دناڤ پرسگەهـ ێدا بهەلبژێرین، هەروەکو د وێنەیدا دیارە:

پاشان دێ دۆگما (Next) کلیك کەین، بۆکسەکا دی دێ بەرچاڤبیت، کو دشیاندایە دناڤدا کردارێن بیرکاریێ لسەر چەند فیلدان بکاربینین ئەوژی ب هەلبژارتنا پشکا (Summary) ولدووڤدا کلیککرن لسەر دۆگما (Summary Option) وهەلبژارتنا کردارا پێدڤی، لێ ئەگەر مەبڤێت پرسگەه ئاسایی بیت هەروەکو شێوەیێ مە بەری نوکە لسەر ئاخفتی دێ بتنێ دۆگما (Next) کلیك کەین.

لدووفدا دێ بۆکسەیەکا نوی بەرچاڤبیت، کو تایبەتە بۆ دانانا ناڤەکی بۆ پرسگەهێ وەروەسا شێوازێ دیار کرنا پرسگەهێ .

لدوماهیێ دێ دۆگمە (Finish) کلیك کەین.

بیزانینین گشتی : Select Query

| زنجیره | ناڤ | پیشه | مووچه | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیه | ناڤ ونیشان | وێنه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | سمیر محمد حسن | ماموستا | $٤٢٥,٠٠ | ٢ | ٢١/٠٧/١٩٧٠ | ☐ | دهوك | Package |
| ٢ | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $٧٠٠,٠٠ | ٠ | ١٠/١٠/١٩٨٠ | ☐ | زاخو | Package |
| ٣ | احسان محمد سلیمان | ماموستا | $٥٠٠,٠٠ | ٤ | ٠١/٠٧/١٩٦٨ | ☐ | زاخو | |
| ٤ | بهار احمد ابراهیم | ماموستا | $٤٠٠,٠٠ | ٠ | ٠٤/٠٢/١٩٨٢ | ☐ | دهوك | |
| ٥ | كوردستان كمال انور | ئەندازیار | $٥٥٠,٠٠ | ١ | ٢٠/٠٣/١٩٨٤ | ☐ | دهوك | |
| ٦ | كامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $٤٨٠,٠٠ | ٣ | ١١/١٢/١٩٦٦ | ☑ | دهوك | |
| ٧ | حسین ابراهیم كریم | ماموستا | $٤٧٠,٠٠ | ١ | ٠٣/٠٢/١٩٧٥ | ☐ | سێمێل | |
| ٨ | ڤیان جمیل جمال | ماموستا | $٥٠٠,٠٠ | ٣ | ٠٢/٠٢/١٩٧٠ | ☐ | ئامێدیێ | |

Record: ١ of ٨

ئەگەر مەبڤێت هندەك زانیاریان لدووڤ پرسیارەکێ (مەرجەکی) بەرچاڤبکەین، پێدڤییە بچینە دناڤ دیزاینا پرسگەهێدا ئەوژی بکلیککرن لسەر ئایکونێ ( Design)، پاشان دخانەیێن (Creteria و Or) دێ پرسیار(مەرجێ) خۆ نڤیسین، هەروەکو مە بەری نوکە شلوڤەکری.

وەکو بەری نوکە مە دیارکری پشتی دانانا پرسیاران(مەرجان) پێدڤییە ئایکونێ ( Run) یان ژی ئایکونێ ( View) کلیکبکەین.

❖هەر وەکو د ئامادەکرنا خشتەیان مە (New) بکارئینایە، لڤێرەدا بۆ چێکرن یان ئامادەکرنا پرسگەهەکا نوی دێ هەمان فەرمان بکارئینین. پشتی کلیککرن لسەر (New) دێ ئەڤ بۆکسە بەرچاڤبیت.

❖Crosstab Query Wizard

پرسگەهەکا ژمێریاریە بۆ پۆلینکرنا زانیاریێن دناڤ خشتەیدا دهێتە بکارئینان.

نموونە : ئەگەر ئەڤ خشتەیە مە هەبیت:

ئەگەر مە بڤێت بزانین سەرجەمێ ئەو مووچەییێن لهەر قەزایەکێ لسەر ئاستێ (پیشە) ی دهێنە وەرگرتن.

Table : بێزانین

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | قەزا | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 2 | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 4 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| 5 | کوردستان کمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| 7 | حسین ابراهیم کریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

لدەسپێکێ دێ (Crosstab Query Wizard) کلیك کەین و پاشان دێ (OK) کلیك کەین.

ئەڤ بۆکسە دێ بەرچاڤبیت، کو دناڤدا (خشتە یان پرسگەها زانیاریان ژێ وەرگرین) دێ هەلبژێرین.

پاشان دێ دۆگما (Next) کلیك کەین، ئەڤ بۆکسەیا دی دێ بەرچاڤبیت، کو دناڤدا فیلدێ مەبڤێت لسەر ئاستێ وێ سەرجەمی بینینە دەر ئەوژی دنموونەیا مەدا فیلدێ (قەزا) یە.

بنێره‌ وێنه‌ى، دشیاندایه‌ لسه‌ر ئاستێ (٣) فیلدان ئه‌م كرداره‌كا بیركاریێ وه‌ربگرین. پشتی هنارتنا فیلدێ (قه‌زا) بۆ لایێ راستێ دێ دۆگما (Next) كلیككه‌ین، بۆكسه‌كا دێ دێ به‌رچاڤبیت، كو دناڤدا دێ فیلدێ (پیشه‌) هه‌لبژێرین لدووڤ نموونه‌یا مه‌. دڤێ بۆكسێدا دشیاندایه‌ بتنێ فیلده‌ك بهێته‌ هه‌لبژاردن.

دێ دۆگما (Next) كلیك كه‌ین، بۆكسه‌كا نوی دێ به‌رچاڤبیت، كو دناڤدا فیلدێ(مووچه‌) دگه‌ل كردارا كۆمكرنێ (Sum) دێ هه‌لبژێرین.

پاشان دێ دۆگمە (Next) كليك كەين، دێ بۆكسا دوماهيكێ بەرچاڤبيت، كو دشياندايە دناڤدا ناڤەكى بدەينە پرسگەهێ و شێوازێ ڤەكرنا پرسگەهێ (ديار كرنا زانياريان يان ديزاينا پرسگەهێ) هەلبژێرين.

پشتی کلیککرنا لسەر دۆگما (Finish) وهەلبژاردنا دیار کرنا زانیاریان دێ
زانیاریێن پرسگەهێ بڤی شێوێ لخوارێ دیار کری بەرچاڤبن.

| قەزا | Total Of مووچە | ئەندازیار | فەرمانبەر | مامۆستا |
|---|---|---|---|---|
| ئامێدی | $500.00 | | | $500.00 |
| دهوك | $1,855.00 | $550.00 | $480.00 | $825.00 |
| زاخو | $1,200.00 | $700.00 | | $500.00 |
| سێمێل | $470.00 | | | $470.00 |

Record: 1 of 4

## ❖Find Duplicate Query Wizard

بۆ دیارکرنا زانیاریێن دووبارەکری دناڤ خشتەیدا دهێتە بکارئینان.

**نموونه :**

دخشتەیێ مەدا ئەگەر مەبڤێت دفیلدێ (پیشه) دا دیار بکەین ئەو پیشەیێن دووبارەکری (ژمارەیا وان یان ژی زانیاریێن وان).

Table : پێزانین

| زنجیره | ناڤ | پیشه | مووچه | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەككەفتیە | قەزا | وێنه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمير محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| 2 | جلال سليم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| 3 | احسان محمد سليمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| 4 | بهار احمد ابراهيم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| 5 | كوردستان كمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| 6 | كاميران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| 7 | حسين ابراهيم كريم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤيان جميل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

پشتی (Find Duplicate Query Wizard) دەستنیشاندکەین دێ دۆگما (OK) کلیك کەین.

دێ بۆکسەك بقی شێوەی بەرچاڤبیت.

خشتەیێ مەبەست پێ دێ دەستنیشانکەین، هەروەکو د وێنەیدا دیار، پاشان دێ دۆگمە (Next) کلیك کەین، ئەڤ شێوەیێ لخوارێ دیار کری دێ بەرچاڤبیت.

لدووڤدا ئەو فیلدێ مە بڤێت دووبارەکرنێن وێ دیار بکەین، (د نموونەیا مەدا فیلدێ (پیشە) یە) دێ ڤەگوهێزین بۆ خانەیا (Duplicate Value Fields)، هەروەکو دیار د ڤێ وێنەیدا.

پاشان دێ دۆگما (Next) کلیك کەین، ئەڤ وێنەیێ لخوارێ دیار کری بەرچاڤدبیت، ئەگەر دڤێ بۆکسێدا مە چ فیلد نەهلبژارتن (وێنەیێ A) دێ بتنێ ناڤێ پیشەی و ژمارەیا دووبارەکرنا وێ بەرچاڤبیت، لێ ئەگەر مە چەند فیلدەك ڤەگوهاستنە خانەیا (Additional Query Fields) (وێنەیێ B) دێ دگەل جۆرێ پیشەی چەند زانیاریێن دی بەرچاڤبن.

پاشان دێ دۆگما (Next) کلیك کەین، بۆکسا دوماهیکێ دێ بۆمە بەرچاڤبیت، هەروەکو بەری نوکە مە دیار کری کو ئەڤ بۆکسە یا تایبەتە ب دانانا ناڤەکی بۆ پرسگەهێ هەروەسا دیار کرنا شێوازێ بەرچاڤکرنا پرسگەهێ، دڤێ بۆکسێدا دێ دۆگما (Finish) کلیك کەین.

پاشان لدووف شێوازێ هەلبژاردنا فیلدان، ئەوا هاتیە دیار کرن د وێنەیێن (A و B) دا، دێ زانیاری بڤی شێوەی بەرچاڤبن.

دووبارەکرنا زانیاریان : Select Query

| Field پیشە | NumberOf |
|---|---|
| ئەندازیار | 2 |
| مامۆستا | 5 |

دووبارەکرنا زانیاریان : Select Query

| پیشە | ناڤ | مووچە | ژمارا زارویان |
|---|---|---|---|
| ئەندازیار | کوردستان کمال انور | $550.00 | 1 |
| ئەندازیار | جلال سلیم محمد | $700.00 | 0 |
| مامۆستا | ڤیان جمیل جمال | $500.00 | 3 |
| مامۆستا | حسین ابراهیم کریم | $470.00 | 1 |
| مامۆستا | بهار احمد ابراهیم | $400.00 | 0 |
| مامۆستا | احسان محمد سلیمان | $500.00 | 4 |
| مامۆستا | سمیر محمد حسن | $425.00 | 2 |
| | | $0.00 | 0 |

Record: 1 of 7

١-لدووف هەلبژاردنا وێنەیێ (A) ٢-لدووف هەلبژاردنا وێنەیێ (B)

ئەگەر بنێرینە هەردوو خشتەیان دێ بینین کو (٢) ژوان ئەندازیارن و (٥) ژی مامۆستانە.

## *Find Unmatched Query Wizard

بۆ جوداکرنا زانیاریێن نە هەڤپشك دناڤبەرا دوو خشتەیان دهێتە بکارئینان.

**نموونە :** ئەگەر مە دوو خشتە هەبن (پێزانین، زانیاری)، کو ئەڤە ژی وێنەیێن وانە:

Table : پێزانین

| | زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | قەزا | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ◂ | 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| | 2 | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| | 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| | 4 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| | 5 | کوردستان کمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| | 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| | 7 | حسین ابراهیم کریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| | 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| * | umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

خشتەیێ (پێزانین)

Table : زانیاری

| | زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | قەزا | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ◂ | 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/1970 | ☐ | دهوك | Package |
| | 2 | جلال سلیم محمد | ئەندازیار | $700.00 | 0 | 10/10/1980 | ☐ | زاخو | Package |
| | 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/1968 | ☐ | زاخو | |
| | 4 | بژین سلیم احمد | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/1982 | ☐ | دهوك | |
| | 5 | کوردستان محمد جمیل | ئەندازیار | $600.00 | 1 | 20/03/1984 | ☐ | دهوك | |
| | 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/1966 | ☑ | دهوك | |
| | 7 | حازم محمد علی | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/1975 | ☐ | سێمێل | |
| | 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/1970 | ☐ | ئامێدیێ | |
| * | umber | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

خشتەیێ (زانیاری)

مەبەستا مە جوداكرنا  وان ناڤێن دخشتەیێ (پێزانین)دا هەین و دناڤ خشتەیێ (زانیاری)دا نەبن.

ئەڤ كردارە دێ بڤی شێوەی هێتە ئەنجامدان:-

لدەسپێكێ د پشكا (Query) دا، دێ ئایكۆنێ (New) كلیك كەین.

دناڤ ڤێ بۆكسێدا دێ (Find Unmatched Query Wizard) هەلبژێرین، پاشان دێ دوگما (OK)كلیك كەین. ئەڤ بۆكسا لخوارێ دیار كری دێ بەرچاڤبیت، دشیاندایە دڤێ بۆكسێدا خشتەیێ سەرەكی هەلبژێرین، دنموونەیا مەدا خشتەیێ (پێزانین) دێ هەلبژێرین.

لدووڤدا دێ دۆگما (Next) كليك كەين، بۆكسەكا دێ بەرچاڤدبيت كو دشياندايە دناڤدا خشتەيێ دهێتە بەراوردكرن دگەل خشتەيێ سەرەكی(پێزانين) بهەلبژێرين، دنموونەيا مەدا خشتەيێ (زانياری)يە.

پاشان دێ دۆگما (Next) كليك كەين، دناڤ بۆكسا نويدا دێ فيلدێ (ناڤ) دخانەيێن هەردوو خشتەياندا هەلبژێرين، هەروەكو ديار دڤی وێنەيدا.

پشتی فيلدێ (ناڤ) ژ هەردوو خشتەيان دهێتە هەلبژاردن، دێ ئايكونێ ( <=> ) كليك كەين.

پاشان دی دۆگمەیا (Next) کلیککەین، ئەڤ بۆکسەدێ بۆمە بەرچاڤببیت، کو دشیاندایە دناڤدا فیلدێن مە بڤێت دناڤ خشتەیدا دیار بن بهەلبژێرین.

لدوماهیێ ئەڤ بۆکسا تایبەتە ب داناناڤەکی بۆ پرسگەهێ هەروەسا دیار کرن شێوازێ بەرچاڤکرنا پرسگەهێ دیار دبیت.

دڤێ بۆکسێدا دێ دوگمە (Finish) کلیك کەین. ئەنجامێن دوماهییێ دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبن.

| ژمارا زارویان | مووچە | پیشە | ناڤ |
|---|---|---|---|
| 0 | $400.00 | مامۆستا | بهار احمد ابراهيم |
| 1 | $550.00 | ئەندازیار | كوردستان كمال انور |
| 1 | $470.00 | مامۆستا | حسين ابراهيم كريم |
| 0 | $0.00 | | |

## سێیێ / فۆرم Forms

بۆ بەرچاڤکرنا زانیاریێن ل بنکا زانیاریان (داتابەیس) بشێوەیێ فۆرمەکێ، دێ ڤان ڕێکێن ل خوارێ دیارکری بکارئینین.

### *Design View

١-دناڤ بۆکسەیا داتابەیسیدا (Forms) کلیکدکەین.

٢-ئایکونێ (New) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسا لخوارێ دیار کری بەرچاڤدبیت، کو ڕێکێن دروستکرنا فۆرمان دگەل ناڤێن خشتە وپرسگەهێن داتابەیسی دناڤدانە، وەکو نموونە مەدڤێت بڕێیا (Design View ) فۆرمەکی بۆ خشتەی یان پرسگەهێ دروستبکەین، دێ (Design View) هەلبژێرین و خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین، هەروەکو د وێنەیدا دیار.

٣- دێ دۆگما (OK) كليك كەين، ئەڤ بۆكسا لخوارێ ديار بەرچاڤدبيت.

٤- برێيا ڕاكێشان وبەردانێ بكليكا چەپێ يا ماوسى فيلدێن مەبەست پێ دێ كێشينە دناڤ تۆڕا فۆرمى.

٥- لسەر تۆڕا فۆرمى دشياندايە لدووڤ حەزا مە شێوە و قەبارێ فيلدان و گونجاندنا وان دەستكاريێ تێدا بكەين.

پشتى دەستكاريكرن لسەر فۆرمى بڤى شێوەى بەرچاڤدبيت:-

٦- دێ ئایکۆنێ (View) کلیك کەین، فۆرم دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت.

ئەگەر مەبڤێت وێنە ب تمامەتی جهێ دیار کری بگریت، دێ لسەر وێنەی بدۆگما راستێ یا ماوسی کلیك کەین، دێ لیستەیەك بەرچاڤبیت دناڤدا دێ فەرمانێ (Properties) کلیك کەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت:

Bound Object Frame: وێنة

Format | Data | Event | Other | All

| Property | Value |
|---|---|
| Name | وێنة |
| Control Source | وێنة |
| Size Mode | Clip |
| Class | |
| Source Doc | |
| Source Item | |
| Auto Activate | Double-Click |
| Display Type | Content |
| Update Options | Automatic |
| Verb | 0 |
| OLE Type Allowed | Linked |
| Status Bar Text | |
| Visible | Yes |
| Display When | Always |
| Enabled | Yes |
| Locked | No |
| Tab Stop | Yes |
| Tab Index | 8 |
| Left | 0.0417" |
| Top | 0" |
| Width | 1.25" |

دناڤ ڤێ بۆكسێدا دناڤ خانەیا (Size Mode) دا دێ (Stretch) هەلبژێرین.

وێنە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت

## Form Wizard*

دشیاندایە فۆرمان ئامادەبکەین برێیا مفا وەرگرتن ژ شێوازێن ئامادەکری دناڤ پرۆگرامیدا، ئەو ژی برێیا (Form Wizard) بڤان پێنگاڤێن لخوارێ دیار کری:

١-کلیککرن لسەر(Form Wizard) پاشان کلیککرن لسەر دۆگما(OK).

٢-دناڤ بۆکسا نویدا دشیاندایە خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ هەلبژێرین و ئەو فیلدێن پێدڤی بۆ ناڤ فۆرمێ دێ دەستنیشانکەین برێیا هنارتنا وان بۆ خانەیا (Selected Fields).

٣- لدووڤدا دۆگما (Next) دێ كلیك كەین، بۆكسەكا نوی بەرچاڤدبیت، كو دشیاندایە برێیا وێ شێوازێ بەرچاڤكرنا فۆرمی وەك (ستووینی، خشتەیی، شیت، ... هتد) دیار بكەین.

٤- بكلیككرن لسەر دۆگما (Next)، ئەڤ بۆكسا ل خوارێ بەرچاڤ دبیت، كو دشیاندایە دناڤدا پاشی یا فۆرمێ بگوهۆڕین ژ شێوازەكی بۆ شێوازەكێ دی.

٥-بکلیککرن لسەر (Next) بۆکسا دوماهیێ بەرچاڤدبیت کو تایبەتە بۆ ناڤکرنا فۆرمێ.

٦- کلیککرن لسەر (Finish) فۆرم دێ ب ڤی شێوەی هێتە دروستکرن.

## *Auto Form Columnar

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بشێوازەکێ ستووینی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤێ رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Columnar) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢-دۆگما (OK) کلیك دکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

تۆمارا ژمارە (١)

تۆمارا ژمارە (٢)

تۆمارا ژمارە (٣)

تۆمارا ژمارە (٤)

## *Auto Form Tabular

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بشێوازەکێ خشتەیی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤێ رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Tabular) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢-دۆگما (OK) کلیکدکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

## Auto Form Datasheet*

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بشێوازێ شیتەکێ ئێکسلی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤی رێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Datasheet) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢-دۆگما (OK) کلیکدکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

بیزانین

| زنجیرە | ناڤ | پیشە | مووچە | ژمارا زارویان | ژدایك بوون | ئایا پەککەفتیە | قەزا | وێنە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | سمیر محمد حسن | مامۆستا | $425.00 | 2 | 21/07/197 | ☐ | دهوك | Bitmap Imag |
| 2 | بهار احمد ابراهیم | مامۆستا | $400.00 | 0 | 04/02/198 | ☐ | دهوك | Bitmap Imag |
| 3 | احسان محمد سلیمان | مامۆستا | $500.00 | 4 | 01/07/196 | ☐ | زاخو | Bitmap Imag |
| 5 | کوردستان کمال انور | ئەندازیار | $550.00 | 1 | 20/03/198 | ☐ | دهوك | Bitmap Imag |
| 6 | کامیران جمال قادر | فەرمانبەر | $480.00 | 3 | 11/12/196 | ☑ | دهوك | |
| 7 | حسین ابراهیم کریم | مامۆستا | $470.00 | 1 | 03/02/197 | ☐ | سێمێل | |
| 8 | ڤیان جمیل جمال | مامۆستا | $500.00 | 3 | 02/02/197 | ☐ | ئامێدیێ | |
| (AutoNumbe | | | $0.00 | 0 | | ☐ | | |

## *Auto Form Pivot Table

ب ڤێ رێکێ دشیاندایه فیلدان لدووڤ حەزا مە بکاربینین بۆ دروستکرنا فۆرمی وبڤی شێوێ لخوارێ دیارکری:

١- (Auto Form Pivot Table) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢-دوگما (OK) دێ کلیك کەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

پاشان بڕێیا ڕاکێشان وبەردانێ بکلیکا چەپێ یا ماوسی ئەو فیلدێن مەبەست پێ دێ ڤەگوهێزین بۆ ناڤ پەنجەرێدا، بڤی شێوەی بەرچاڤدبیت:

## Auto Form Pivot Chart*

بۆ دروستکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بشێوازێ هێلکارەکێ ڕێکخستی دهێتە بکارئینان. پێنگاڤێن دروستکرنا فۆرمان بڤێ ڕێکێ دێ بڤی شێوەی بن:

١- (Auto Form Pivot Chart) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢-دۆگما (OK) کلیکدکەین، فۆرم ئێکسەر دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

پاشان بڕێیا ڕاکێشان وبەردانێ بکلیکا چەپێ یا ماوسی ئەو فیلدێن مەبەست پێ دیار بکەین دناڤ هیلکاریدا دێ کێشینە جهێ مەبەست پێ، بڤی شێوەی.

## *Chart Wizard

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا فۆرمی بشێوێ هێلکاری دهێتە بکارئینان. بڤی شێوەی:

١- (Chart Wizard) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢- دۆگما (OK) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسا لخوارێ دیار بەرچاڤدبیت، دشیاندایە وان فیلدان هەلبژێرین ئەوێن مەبەست پێ کو بدانینە دناڤ تۆرا هێلکاری وبڤی شێوەی:

٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە دناڤدا شێوازێ هێلکاری دەستنیشانبکەین:

٤- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە دناڤدا فیلدێن هەلبژارتی ڤەگوهێزین بۆ جهێ مەبەست پێ دناڤ هێلکاریدا:

**تێبینی:**

دشیاندایە بڕێکا Preview Chart هێکاری ببینین.

٥-دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە ناڤەکی بدەینە فۆرمی.

٦-دۆگما (Finish) کلیکدکەین، هێلکاریێ مە دێ بشێوێ دیار کری هێتە دروستکرن، کو دشیاندایە گوهۆڕانکاریا دناڤ هێلکاریدا بکەین ژ ئالیێ رەنگ وقەبارە وجۆرێ نڤیسینێ ئەوژی بڕێیا جووت کلیککرن لسەر وی بەشێ مەبەست پێ.

## *Pivot Table Wizard

بڤێ رێکێ دشیاندایە فیلدان لدووف حەزا مە بکاربینین بۆ دروستکرنا فۆرمی وبڤی شێوەیێ لخوارێ دیارکری:

١-(Pivot Table Wizard) کلیکدکەین و دێ خشتەی یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشانکەین.

٢- دۆگما ( OK) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت:

٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە برێیا وی (خشتەی یان پرسگەهـ) یان فیلدێن مەبەست پێ بۆ فۆرمی دیاربکەین.

٤-دۆگما (Finish ) کلیکدکەین ، فۆرمەك بڤی شێوەی دهێتە دروستکرن.

پاشان بڕێیا ڕاکێشان وبەردانا کلیکا چەپێ یا ماوسی فیلدێن مەبەست پێ دێ هێنە کێشان بۆ ناڤ تۆڕا فۆرمی.

## چوار/ ڕاپۆرت Reports

دهێته بکارئینان بۆ بەرچاڤکرنا زانیاریێن دەستنیشانکری ژ ناڤ داتابەیسێدا (بنکا زانیاریان) بشێوەیێ ڕاپۆرتەکا چاپکری یان ژی هنارتنا راپۆرتێ بۆ پرۆگرامەکێ دی وەك (مایکرۆسۆفت وورد، مایکرۆسۆفت ئێکسل، ... هتد)، ب ڤی شێوەیێ لخوارێ دیار کری دشیاندایە راپۆرتەکێ دروستبکەین:

### *Design View

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتێ لدووڤ حەزا مە دهێتە بکارئینان، بڤی شێوەی:

١- (Design View) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.

٢- دۆگما (OK) کلیکدکەین، بۆکسەك بەرچاڤدبیت کو دبێژنێ تۆرا دیزاینا راپۆرتێ، دشیاندایە فیلدێن مەبەست پێ د راپۆڕتێدا داربن برێیا راکێشان وبەردانێ ب کلیکا چەپێ یا ماوسی ڕاکێشینە دناڤ تۆرێدا بۆ ناڤ پشکا ناڤەرۆکێ (Details) دا.

**تێبینی :** تۆڕا راپۆرتێ ژ ڤان پشکان پێك دهێت.

أ-(Report Header): زانیاریێن ڤێ پشكێ بتنێ ل بەرپەڕێ ئێكێ یێ راپۆرتێ بەرچاڤدبن، بۆ دیارکرنا ناڤێ راپۆرتێ دهێتە بکارئینان.

ب-(Page Header): زانیاریێن ڤێ پشكێ ل ئالیێ سەری یێ هەمی بەرپەڕێن راپۆرتێ بەرچاڤدبن، وەکو نموونە بۆ دیار کرنا ناڤ ونیشانێن فیلدان دهێتە بکارئینان.

ج-(Details) : بۆ دیار کرنا زانیاریێن ناڤەرۆکا راپۆرتێ دهێتە بکارئینان. وەکو نموونە فیلد دناڤ ڤێ پشکێدا دهێنە دانان.

د- (Page Footer) زانیاریێن ڤێ پشكێ ل ژێریا هەمی بەرپەڕێن راپۆرتێ بەرچاڤدبن، وەکو نموونە بۆ دیار کرنا ژمارا بەرپەری.

هـ- (Report Footer): زانیاریێن ڤێ پشكێ ل دوماهیا بەرپەڕێ دوماهیكێ دهێنە بەرچاڤکرن، وەك نموونە بۆ دیار کرنا ئەنجامێن کۆرتیا راپۆرتێ دهێتە بکارئینان.

٣- دی ئایكۆنی ( View) كلیك كەین راپۆرتا هاتیە دیزاینكری دێ بقی شێوەی بەرچاڤببیت.

## *Report Wizard

بكارئينانا ڤێ رێكی راپۆڕت بڤی شێوەی دهێنه دروستكرن:

١- (Report Wizard) كليكدكەين، خشته يان پرسگەها مەبەست پێ دەستنيشاندكەين. پاشان دۆگما ( OK ) كليكدكەين.

٢- بۆكسەكا نوی بەرچاڤدبيت، ئەگەر د خالا (١) دا خشته يان پرسگەه نەهاتبيته دەستنيشانكرن دشياندايه دڤێ بۆكسێدا دەستنيشانبكەين، فيلدێن مەبەست پێ بەرچاڤبن د راپۆڕتێدا دێ هێنه هنارتن بۆ خانەيا (Selected Fields) برێيا ئايكۆنێن هنارتن وڤەگەريانێ هەر وەكو ديار دوێنەيدا.

٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، بۆکسەکا نوی بەرچاڤدبیت، دشیاندایە برێیا ڤێ بۆکسێ زانیارییێن خۆ پۆلینبکەین، ئەوژی بهنارتنا فیلدێ پێدڤی بۆ لایێ راستێ برێیا ئایکۆنێن دخالا (٢)دا هاتینە دیار کرن.

٤- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسا لخوارێ دیار کری بەرچاڤدبیت، کو دشیاندایە رێزبەندیا زانیاریان لدووڤ فیلدەکی بۆ دەستنیشانبکەین. هەروەکو دیار د وێنەیدا. بۆ تێبینی دشیاندایە چ فیلدان دڤێ بۆکسێدا دەستنیشان نەکەین ب وێ چەندێ زانیارییێن مە نەرێزبەندکری بەرچاڤدبن.

٥- دۆگما (Next) كلیكدكەین، ئەڤ بۆكسا لخوارێ دیار كری بەرچاڤدبیت، كو دشیاندایە شێوازێ راپۆرتێ دەستنیشانبكەین، ژ ئالیێ شێوەیێ راپۆرتێ (ناڤ ونیشان و ناڤەرۆك) و ژ ئالیێ راپۆرت بشێوەیەكێ پانیی یان بلنداهی بیت.

٦- دۆگما (Next) كلیكدكەین، ئەڤ بۆكسا لخوارێ دیار كری بەرچاڤدبیت، كو دشیاندایە بڕێیا وێ ستایلێ پێدڤی بۆ راپۆرتێ دەستنیشانبكەین.

٧-دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت، کو دشیاندایە بڕێیا وی ڕاپۆرتا خۆ بناڤ بکەین.

٨-دۆگما (Finish) کلیکدکەین، ڕاپۆرتا مە دێ بقی شێوەی بەرچاڤبیت:

## *Auto Report : Columnar

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوەیەکێ ستووینی دهێتە بکارئینان.

پێنگاڤێن ڤێ رێکێ بڤی شێوەینە:

١- (Auto Report: Columnar) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.

٢-بکلیککرن لسەر دوگما ( OK ) راپۆرتا مە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت.

## Auto Report: Tabular *

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوەیێ خشتەیەکێ دهێتە بکارئینان.

پێنگاڤێن ڤێ رێکێ بڤی شێوەینە:

١-(Auto Report : Tabular) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەهـا مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.

٢-بکلیککرن لسەر دۆگما (OK) راپۆرتا مە دێ بقی شێوەی بەرچاڤبیت

## Chart Wizard *

ئەڤ رێکە بۆ دروستکرنا راپۆرتەکێ بشێوێ هێلکاری دهێتە بکارئینان.

١- (Chart Wizard) کلیکدکەین، خشتە یان پرسگەها مەبەست پێ دەستنیشان دکەین.

٢- دۆگما (OK) کلیکدکەین ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت، کو دشیاندایە فیلدێن مەبەست پێ بۆ راپۆرتا هێلکاری دەستنیشانبکەین و ڤەگوهێزینە لایێ (Fields For Chart) هەروەکو دیار د وێنەیدا.

٣- دۆگما (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە شێوەیێ هێلکاری دەستنیشانکەین.

٤- دۆگمە (Next) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت کو دشیاندایە فیلدان برێیا راکێشان وبەردانێ بۆ تۆڕا هێلکاری رابکێشین لدووڤ حەزا مە.

٥- دۆگمە (Next) کلیکدکەین، بۆکسا دۆماهیێ بەرچاڤدبیت، کو دناڤدا پێدڤییە ناڤەکێ بدەینە راپۆرتێ.

٦- دۆگما (Finish) کلیکدکەین، راپۆڕتا مە دێ بڤی شێوەی بەرچاڤبیت:

## چەوانیا رێکخستن وچارەسەرکرنا بنکا زانیاریان

بۆ بچووك كرنا قەبارێ دووسەیا بنكا زانیاریان(داتابەیسێ) و چارەسەركرنا وێ كو هندەك جاران وەكو هێما زانیاریان بەرچاڤدكەت یان هەر ئاریشەكا دی كو تۆشی داتابەیسێ دبیت، بۆ ئەنجامدانا ڤان هەردوو كاران (بچووككرنا قەبارەی و چارەسەركرن) دێ ڤان رێكا بكارئینین:

دناڤ دووسەیا بنكا زانیاریان دێ لیستەیا (Tools) ڤەكەین، پاشان دێ (Database Utilities) هەلبژێرین و پشكا (Compact and Repair Database) كلیك كەین بشێوەیەكێ زێندی دێ دووسەیا مە هیتە ڤشارتن و چارەسەریا ئارێشەیان دهێتە ئەنجامدان.

# Startup

مفا ژ ڤی فەرمانی دهێتە وەرگرتن بۆ ڤەکرنا فۆرمەکێ بشێوەیەکێ ئێکسەر ددەمێ داتابەیسا مە ژ گەلەك پشکان پێك بهێت، ئەو فۆرما دهێتە دەستنیشانکرن وەك Startup دێ زانیاریان یان دۆگمەیان لسەر ئامادەکەین ژبۆ چوون و دەرکەفتنێ ژناڤ فۆرمێن دی یێن پرۆگرامی، وبشێوەیەکی دی دبێژنە ڤێ فۆرمێ (دارا لقان).

بۆ دانانا فۆرمەکێ وەك Startup دێ ڤان پێنگاڤان بکارئینین:

١-دێ دووسەیا داتابەیسێ ڤەکەین، لیستا ( Tools ) کلیکدکەین، ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت.

٢-دناڤ پشکا (Displayform/page) فۆرمێ مەبەست پێ دەستنیشاندکەین و پاشان دێ دۆگما (OK) کلیك کەین.

هەردەمەکێ ئەڤ دووسەیا دهێتە ڤەکرن دێ ئێکسەر ئەڤ فۆرمە هێتە بەرچاڤکرن.

## راهێنان

پ١/(داتابەیسەکێ Database) دناڤ درایڤێ (D) دا بناڤێ (لیستا مووچەیان) ڤەگرە، پاشان بەرسڤا ڤان لقێن لخوارێ دیارکری بدە:

أ- ئەڤ خشتەیێ لخوارێ دیار کری بڕێیا (Design View) دروستبکە،پاشان بناڤێ (ئازادی) ڤەگرە، جۆرێ فۆنتی بکە (Ali_K_Samik) ب قەبارێ (١٦).

| ز | ناڤێ سێ قولی | باوەرنامە | مووچە | پیشە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | جوان احمد سليم | بەکەلوریوس | ٧٠٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٢ | پيمان محمد عبدالله | دبلوم | ٦٥٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٣ | سلاح جميل ابراهيم | ماستەر | ١٢٠٠٠٠٠ | مامۆستا |
| ٤ | حميد حسين سعيد | بەکەلوریوس | ٩٠٠٠٠٠ | ئەندازیار |
| ٥ | دلين اسماعيل حسن | بەکەلوریوس | ٧٠٠٠٠٠ | پارێزەر |
| ٦ | احمد على حسين | دبلوم | ٥٣٠٠٠٠ | فەرمانبەر |

پاشان مووچەیێن دووبارە ژێك جۆدا بکە.

ب-راپۆڕتەکێ بڕێیا (Report Wizard) لسەر خشتەیێ (ئازادی) دروستبکە و بناڤێ (کۆردستان) ڤەگرە.

ج- ئەڤ خشتەیێ لخوارێ دیار کری برێیا پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئێکسل دروستبکە، جۆرێ فۆنتی بکە (Ali_K_Samik) ب قەبارێ (١٦)، دناڤ درایڤەکیدا بناڤێ (سەربەستی) ڤەگرە، پاشان برێیا (Import Table) بینە دناڤ پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئەکسسی دا و بهەمان ناڤ ڤەگرە.

| ز | ناڤێ سێ قولی | مووچە |
|---|---|---|
| ١ | زەینەب رسول محمد | ٥٠٠٠٠٠ |
| ٢ | ئەلند حسین جمال | ٧٥٠٠٠٠ |
| ٣ | پەروەر کریم جادر | ١٠٠٠٠٠٠ |
| ٤ | دلوار سعید محمد | ٩٠٠٠٠٠ |

د- فۆرمەکی برێیا (Form Wizard) لسەر خشتەیێ (سەربەستی) بتنێ بۆ فیلدێن (ناڤێ سێ قولی و مووچەی) دروستبکە، پاشان ب هەمان ناڤ ڤەگرە.